بڵاوكراوەكانی نێوەندی ئارام لەبواری تەكنیك زنجیرە 20







AVIRA AntiVir®



ئەم كتێبە دەتپارێزێت لەهەموو جۆرەكانی ڤایرۆس




# ڤایرۆس

## شێوازی بەكارهێنانی 2008

هەموو جۆرە ئەنتی ڤایرۆسەكان

خۆپاراستن لەكاتی بەكارهێنانی ئینتەرنێت دا
خۆپاراستن لەكاتی بەكارهێنانی میمۆری و فلاش دا
خۆپاراستن لەكاتی بەكارهێنانی سیدی و دی ڤی دی
گەران بەهەموو درایڤ و پارتەیشنەكانی كۆمپیوتەردا
ناسینی جۆرەكانی ڤایرۆس
چۆنێتی دابەزاندنەوە و نوێكردنەوەی ئەنتی ڤایرۆسەكان



بڵاوکراوەکانی تیۆەندی Aram لەبواری تەکنیک زنجیرە (٢٠)

# ڤایرۆس

لەگەڵ کتێبەکەدا سیدییەکی بەرنامەکان بەدیاری وەربگرە (سەرجەم ئەوئەنتی ڤایرۆسانەی تییایەکەباسکراوون)

چاپی نوێ ٢٠٠٨


ئامادەکەران

محەمەد مەهدی ئیکرام هادی

پرۆژەی ( ١٠٠ ) کتێبی بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت

زنجیرەی ( ٢٠ )

سەرپەرشتیاری پرۆژەکە:ئارامی مەلا محەمەد

لـــەنێوەنـــدی ئـــارامەوە بڵاودەکـــرێتەوە

لەگەڵ ئەم کتێبەدا سیدییەکی بەرنامەکەوپێویستییەکانی وەربگرە

# ڤـــایرۆس


- ئامادەکردنی :ئیکرام هادی . محەمەد مەهدی
- شوێنی بڵاوکردنەوە:نێوەندی ئارام
- شوێنی چاپ:سلێمانی ٢٠٠٨
- نۆبەتی چاپ:چاپی یەکەم
- تیراژ:هەزاروێنە
- نرخ:٢٠٠٠ هەزار
- ژمارەکانی نێوەندی ئارام:٠٧٧٠١٩١٨٥٦٥--٠٧٥٠١٢٤١٥١٨





## پێشەکی :

**به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

**زۆر خۆشحاڵم که توانیم بۆ ئەم جارەش کتێبێك بنوسم که کێشەیەکی تر لە کێشە گەورەکانی کۆمپیوتەر چارەسەر بکەم یان وەکو ڕێنموییەك بۆ ئەو کەسانەی که شارەزایی زۆریان نیە لە کۆمپیوتەردا ، کە بۆ ئەم جارەش بە پێویستم زانی کە باسی ڕێگاکانی خۆپاراستن لە ڤایرۆس و چارەسەری بکەم کە بوەتە کێشەیەکی زۆر گەورە لە ناوماندا کە ڕۆژانە و سات لە دوای سات ڤایرۆسی نوێ و جۆراوجۆر و کاریگەرتر پەیدا دەبن کە لەگەڵ ئەمەشدا ئەنتی ڤایرۆسی باشتریش دەردەچێت بەڵام هەمیشە بۆ پاراستنی خۆمان پێویستمان بە نوێ کردنەوە هەیە . واتە نوێ کردنەوەی ئەنتی ڤایرۆس کە باسی لێوە دەکەین.**

**هەروەها ڤایرۆس ئەوەندە کاری کردوەتە سەرمان کە زۆر جار لە کارەکانمان دوا دەخات یان وامان لێ دەکات کە ناچار بین لە کارەکانمان بوەستین یان بۆ هەندێ کەس کە نازانێت چی لێ بکات، ناچار دەیباتە بازاڕو پارەی تێدا سەرف دەکات یان زۆر جار فایل و زانیاریەکانی ون دەبن و دەسڕێنەوە . لە بەر ئەمەش ڤایرۆس هەر وەکو نەخۆشی وایە کە وتویانە "خۆپاراستن لە چارەسەر کردن باشترە"واتە کۆمپیوتەرەکانمان بپارێزین لە ڤایرۆس لەوە باشترە کە بە دوای چارەسەر بگەڕێین لە دوای توش بونی بە ڤایرۆس.**

**بەهیوای سوود لێوەرگرتن**

mahammadymehdi@yahoo.com

**محمد مهدی فتاح**







**سەرەتا:**

## ڤایرۆس (Virus):

بەرنامەیەکی داڕێژراوی کۆمپیوتەریە کە توانای دابەش بوون و بلاْو بونەوەی لە کۆمپیوتەرێك بۆ کۆمپیوتەرێکی تری هەیە کە دەچێتە زانیاری و بەرنامەکانەوە, کە هەر وەکو ڤایرۆسی زیندوی هەندێك لە نەخۆشیەکانی مرۆڤە کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزرێتەوە, ڤایرۆسی کۆمپیوتەر کۆمپیوتەرە شەخسیەکان واتە کۆمپیوتەرە تایبەتی کەسەکان ( Personal Computers ) و خزمەتگوزاریەکان تووش دەکات.

هەروەها ئەو کۆمپیوتەرانەی کە دەستیان گرتوە بەسەر پەیوەندی نێوان کۆمپیوتەرەکان, هەندێك لە ڤایرۆسەکان تەنها بێزارکەرو ئیزعاجن, بەلاْم هەندێکی تریان زۆر کاولکارن و کاری خراپ ئەنجام دەدەن و زۆریش بە توانان هەندێك جار زەرەری مەترسیدار دەدەن لە کۆمپیوتەرو زانیاریەکانمان, ڤایرۆسەکان توانای گۆڕینی فایلەکان و سڕینەوەیان و دزینی زانیاریە گرنگ و بە بایەخەکان ,هەلگرتن یان تێکدانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەریان هەیە .

ڤایرۆسەکان زۆر جار لە ڕێگەی ئینتەر نێتەوە داخلی کۆمپیوتەرەکان دەبن کە ئاسانترین و بەربلاْو ترین ڕێگەیە بۆ بلاْو بونەوەی ڤایرۆسەکان کە لە ڕێگای ئیمەیلە ئەلیکترۆنیەکان ( electronic mail (e-mail ) یان لە کاتی پەیوەست بوونی کۆمپیوتەرەکان بە یەکەوە لە ڕێگەی چاتی ئینتەر نێتی ( Chat ) یان لە ڕێگەی کردنەوەی ئەو ماڵپەڕو سایتانەی کە متمانەیان نیە کە بە گرنگترین مەلبەندی بلاْو بونەوەی ڤایرۆسە مەترسیدارەکان دادەنرێت وەك( سایتە سێکسیە کان بە پلەی یەکەم ,سایتە نەزانراو و نەناسراوەکان, سایتی کراك و هاکەرەکان یان ئەو سایتانەی کە بە زۆری بابەتەکانیان بە بێ بەرامبەرە واتە بە خۆڕاییە ( Free ) یە ,سایتە تاکەکەسیەکان و هتد )

لە بەر ئەمانەش پێویستە کە ئەوانەی ئینتەرنێتیان هەیە زۆر بە ئاگا و وریا بن لەم جۆرە سایتانەی کە باسمان کردن , یان ڕێگایەکی تر بۆ بلاْو بونەوەی ڤایرۆسەکان ئیمەیلی نەناسراوە , واتە ئێمە ڕۆژانە چەندین نامەمان بۆ دێت لە ڕێگەی ئیمەیلەوە کە زۆریان نەناسراون بۆیە ئێمە نابێت هەموو جۆرە ئیمەیلێك بکەینەوە تاوەکو سەرچاوەکەی نەزانین واتە بزانین لە لایەن کێوە هاتوە بۆ ئەوەی کە متمانەی پێ بکەیت.

زۆر لە ڤایرۆسەکان وەکو فایلێك یان ئایکۆنی بەرنامەیەك دەردەکەون , زۆر جار لەم ڤایرۆسانە کە هەندێکیان لە ڕێگەی ئیمەیلەوە یان لە ناو فلاش میمۆری ( Flash Disk ) یان ( CD ) یەکانەوە دێن هەتاوەکو ئەیان کەیتەوەو بە کاریان نەهێنیت ناتوانن داخلی کۆمپیوتەرەکەت بن و بێنە ناو کۆمپیوتەرەکەتەوە بۆ نمونە ئەگەر تۆ فلاش میمۆریەکت هەبێت کە هەلگری ڤایرۆسێك بێت کە لەوانەیە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە یان لە ڕێگەی کۆمپیوتەری کەسێکی ترەوە تووشی بووبێت پەیوەندی بکەیت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە یان بیدەیت لە کۆمپیوتەرەکەتەوە ئەوا پاش خوێندنەوەی فلاشەکە لە لایەن کۆمپیوتەرەکەتەوە ئەگەر فلاشەکە نەکەیتەوە ئەو ڤایرۆسە تووشت نابێت بەلاْم ئەگەر بە بێ پشکنین و بەکارهێنانی ئەنتی ڤایرۆسەوە فلاشەکەت بکەیتەوە و داخلی فلاشەکەت بیت ئەوا ئەو ڤایرۆسەش کاری خۆی دەست پێ دەکات و بلاْو دەبێتەوە بە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا کە ڕێگایەکی زۆر ئاسانە بۆی.



## جۆرەکانی ڤایرۆس ( Types of virus ):

ڤایرۆسەکان چەندین جۆری زۆریان هەیە کە لە ژماردن نایەن و بەردەوامیش لە زیاد بووندان ,ڤایرۆسەکان جیا دەکرێنەوە لە یەکتر بە توانای کاولکاریان یان بەهێزیان یان ئەو شوێنانەی کە تێیدا جێگیر دەبێت ,هەروەها ئەو کەسانەی کە ڤایرۆسەکە دروست دەکەن کە بە زۆری کەسانی زۆر شارەزاو بەتوانان لەو بوارەدا کە بۆ دروست کردنی ئەم ڤایرۆسانەش بە زۆری ئەم بەرنامانە بەکاردەهێنن( VB script ,Visual basic script, JAVA script ) هەروەها لە لایەکی ترەوە ڤایرۆس دەکرێت بە چەند جۆرێکەوە وەکو ( Virus,Trojan,Worm,Trojan horse ) کە بە زۆری لەم جۆرە ڤایرۆسانە پێك هاتوون و لە ڤایرۆسێکەوە بۆ ڤایرۆسێکی تر توانای کاولکاریەکەی و کارەکەی دەگۆڕێت, بۆ نمونە ڤایرۆسی وا هەیە کە کاری تەنها گۆڕینی ناوی فۆڵدەرێکە یان گۆڕینی شێوەی نوسین یان فۆنتێکە واتە کارێکی زۆر سادە دەکات و زیانێکی ئەوتۆمان لێ نادات , بەلأم ڤایرۆسی وا هەیە کە دەچێتە فایلەکانی سیستمی ویندۆزەکەمان و تێکیان دەدات کە لە پاش سڕینەوە و لە ناو بردنی ئەم جۆرە ڤایرۆسانە ئەنجامی کارە تێکدەرانەکانی دەمێنێتەوە بۆ نمونە زۆر جار پاش تێکدانی فایلەکانی سیستم زۆر کێشەمان بۆ دروست دەبێت وەکو ( کوژاندنەوەی لە پڕی کۆمپیوتەر,شاردنەوەی Folder Options لە My Computer دا , شاردنەوەی فرمانی Task Manager , خاو بونەوەو سست بوونی زۆر لە ڕادە بە دەری کۆمپیوتەر, لە کارکەوتنی بەشی Regedit ,سڕینەوەی ئایکۆنی بەرنامەو فۆڵدەرەکان, دروست کردنی فایلی زیادە بە ناوی New Folder یان هتد.... )





ڤایرۆس ٧

Ready to install

Please confirm that you are ready to install the selected components



هەر ڤایرۆسەو ناوێکی تایبەتی و دیاری کراوی خۆی هەیە کە پە پێی ئەو ناوەی کە هەیەتی دەناسرێتەوە و جیا دەکرێتەوە کە ئەمانەش هەندێکن لە ناوی ڤایرۆسەکان و کارەکانیان:

W32/bagle.h

جۆر: Worm

قەبارە: ١٨-٢٢ کیلۆبایت

ئەو شوێنانەی کە تێیدا کاری خۆی دەکات: Windows 95,Windows 98,Windows 2000, Windows Me ,Windows XP, Windows NT) ئەم جۆرەیان کرمێکی ئینتەرنێتیە کە لەگەڵ نامەی ئەلیکترۆنی E-mail دا دەگوێزرێتەوەو کاری خۆی دەکات.
هەر ئەوەندەی چوە ویندۆزەوە خۆی دەگوێزێتەوە بۆ فایلەکانی سیستمی ویندۆز و خۆی لە جیاتی ئەم فایلە کۆپی دەکات و ئەم ناوە لە خۆی دەنێت (I 1 1r54n4.exe) کە لەم شوێنەدا جێگیر دەبێت( C:\WINNT\SYSTEM32\i 1 1r54n4.exe) و ئایکۆنی زیادە دروست دەکات بە ناوی جیاوازەوە.

ئەمەی کە باسمان کرد یەك جۆر ڤایرۆسە , کە بە دەیان هەزار جۆری تری وەکو ئەم ڤایرۆسە هەیە کە ئەمە هەندێك لە ناوەکانیانە:

(NYB,NULL.178,Tula.65,VBS/monopoly 1.1,VCC.350,VCM,Vote,W32,w95)



## سیٚ جۆرە سەرەکیەکەی ڤایرۆس:

١.ڤایرۆس (Virus):

هەروەکو لە سەرەتا باسمان کرد کە دەتوانین بلێین کە ڤایرۆس بەرنامەیەکی دارێژراوە کە بە زۆری بە مەبەستی خرلپەکاری لە کۆمپیوتەردا دروست کراون، وە مەترسیڤایرۆسیش زیاد دەکات بە پێی ئەو شێوەی کە دارێژراوە و دروست کراوە و بە شێوەیەکی زۆر خێرا بڵاو دەبێتەوە لە رێگەی ئینتەرنێت یان ئامێرە گوێزەرەوەکان وەکو ( Flash Memory,CD,DVD,Floppy…etc)

٢.کرم (Worm) :

ئەم جۆرە ڤایرۆسە تەنها لە رێگەی ئینتەرنێت و پەیوەندیەکان ( Internet, Networks ) دەگوێزرێتەوە و بڵاو دەبێتەوە ، بۆ نمونە رێگای سەرەکی لە رێگەی نامە ئەلیکترۆنیەکانەوە کە لە شوێن و کەسێکەوە بۆ شوێن و کەسێکی تر دەنێردرێن و پاشان دەست دەکەن بە کاری تێکدەرانەو خراپەکاری بۆ نمونە ( پاش ئەوەی کە بە لایەنی کەمەوە ٥٠٠٠٠ کۆمپیوتەری تووش کرد کە ئەم کارەش بە خێراییەکی زۆر دەبێت چونکە ئەم جۆرە ڤایرۆسانە کاتی وا هەیە کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا و لە یەك ساتدا داخلی چەندین هەزار کۆمپیوتەر دەبن. ئەوا بە پلان و ئەو بەرنامەی کە بۆی دارێژراوە لە یەك کاتدا دەست دەکات بە کاری تێکدەرانەی خۆی کە هەمان کار لە هەموو ئەو کۆمپیوتەرانەی تریشدا روو دەدات بە مەرجێ هەمان ڤایرۆس بێت.

٣.ئەسپی تەروادە (Trojan Horse) :

ئەمیش جۆرێکی ترە لە ڤایرۆس کە ناوەکەشی لەوەوە هاتوە کە دەگەرێتەوە بۆ چیرۆکی بەناوبانگی ( ئەسپی تەروادە ) کە سەربازە یۆنانیەکان لە ناو ئەمەدا خۆیان شاردوەتەوەو توانیویانە بە هۆیەوە شاری ( تەروادە ) بگرن و بچنە ناویەوە و سەرکەوتن بەدەست بهێنن. هەر لەبەر ئەمەشە کە ناوی ئەسپی تەروادەیان لێناوە چونکە بە بێ ئەوەی کە بزانیت چیەو چی دەکات خۆی کاری خۆی دەکات و وێرانکاری خۆی دەکات.

## بۆچی ڤایرۆس دروست دەکرێت؟

ئەمە پرسیارێکی زۆر گرنگە کە زۆر کەس پێ دەچێت نەزانێت یان زۆر حەز بکات کە چ مەبەستێك لەم کارەدایە. بەکورتی دروست کردنی ڤایرۆس بۆ چەند مەبەستێکە کە یەکێکیان نادیارە واتە کەس نازانێت چ کەسێك و بۆ چ مەبەستێك دروستی کردوە زۆر جار پێ دەچێت کە تەنها ئەو کەسەی کە دروستی دەکات چێژ بەم کارەی وەربگرێت یان بە هونەرێك یان بە زانستێکی گرنگی بزانێت.بەلام مەبەستی زانراو و دیاری کراو لە ڤایرۆس بە زۆری مەبەستی ( بازرگانی و سیاسی و ئابوری و سەربازیە ) ،بەلام مەبەستی سەرەکی لە دروست کردنی ڤایرۆس ( بازرگانی )یە ،،،
واتە زۆر جار چەند کەسانێك یان کۆمپانیایەکی نەزانراو لە گەڵ کۆمپانیایەکی گەورەدا بە شاراوەیی و ژێر پەردەیی رێ دەکەون بۆ ئەوەی کە ئەمان ڤایرۆسێك دروست بکەن و بڵاوی بکەنەوە و هەموو زانیاریەکانی ڤایرۆسەکەش بدەنە

کۆمپانیا گەورەکە بەرامبەر بە پارەیەکی زۆر یان بۆ مەبەستێکی خۆیان بۆ ئەوەی کە ئەنتی ڤایرۆس( دژە ڤایرۆس ) یکی باش دروست بکەن کە تەنها ئەو ئەنتی ڤایرۆسە بتوانێت ئەو ڤایرۆسە لە ناو بەرێت کە ئەمان دروستیان کردووە. ناچاریش هەموو کەس دەیکرێت بۆ ئەوەی کە لە دەست ئەو ڤایرۆسە رزگاریان بێت کە تووشی بوون.






# گرنگترین ئەو کارانەی کە پێویستە بۆ ڕێگەگرتن لە تووش بوون بە ڤایرۆس



١.خۆپاراستن لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا:

**وەکو لەسەرەتاشدا بە کورتی ئاماژەم پێ کرد و وەکو ئاگادارکردنەوەیەکیش بۆتان کە لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا چەند ڕێنماییەك هەیە کە پێویستە هەموو ئەو کەسانە بیزانن کە بە کارهێنەری ئینتەرنێتن ئەویش:**

***ئەنتی ڤایرۆسێکی زۆر باش و جێی متمانەت هەبێت لە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا (تەنها یەك ئەنتی ڤایرۆس ((چونکە دوو ئەنتی ڤایرۆس لە کۆمپیوتەرێکدا کارناکەن) ئەنتی ڤایرۆسی باشیش کە لە گەڵ کۆمپیوتەرەکا نمان زۆر چاك بگونجێت و کار لە خێرایی کۆمپیوتەرەکەشمان نەکات ئەنتی ڤایرۆسی(** Kasper Sky **) یە کە یەکێکە لە باشترین ئەنتی ڤایرۆسەکان.**

***تەنها بوونی ئەنتی ڤایرۆس لەناو کۆمپیوتەرەکەتدا مەرجی دڵنیا بوونت نیە لە پاراستنت لە ڤایرۆس بەڵکو پێویستە کە (** Updatc **) ی بکەیتەوە واتە (نوێ کردنەوە) واتە ئەنتی ڤایرۆسەکەت بەلایەنی کەمەوە هەفتەی جارێك یان دوو هەفتە جارێك نوێ بکەیتەوە ئەویش لە ڕێگەی ئینتەرنێت. بۆ ئەوەی کە هەر ڤایرۆسێکی نوێ پەیدا ببێت ئەنتی ڤایرۆسەکەی تۆ بیناسێت و بتوانێت لە ناوی بەرێت. چونکە ئەگەر ئەنتی ڤایرۆسەکەت ئەپ دەیت نەکەیتەوە و نوێی نەکەیتەوە ئەوا ڤایرۆسە نوێکان ناناسێت و ئەگەر داخلی کۆمپیوتەرەکەشت بن پێی نازانێت و نایناسێت واتە نازانێت کە ڤایرۆسێك هاتوەتە کۆمپیوتەرەکەتەوە , لە بەر ئەوە پێویستە زوو زوو ئەپ دەیتی بکەیتەوە.**

***نەکردنەوەی ئەو سایت و ماڵپەڕانەی کە جێی متمانە نین وەکو (سایتە سێکسیەکان بە زۆری کە مەترسیدارترین و بڵاترین ڤایرۆسەکانی تێدایە, سایتە نەزانراو و نەناسراوەکان, سایتی کراك و هاکەرەکان یان ئەو سایتانەی کە بە زۆری بابەتەکانیان بە بێ بەرامبەرە واتە بە خۆڕاییە (** Free **) یە ,سایتە تاکەکەسیەکان و هتد), وە هەوڵ بدەین کە بە زۆری ئەو سایت و ماڵپەڕانە بکەینەوە کە جێی متمانەو جیهانین وەکو سایتە بەناوبانگەکانی (** Google,Yahoo,MSN,BBC,Wickipedia **) یان هەرسایتێکی بەناوبانگ و جێی متمانەی تر .**

٢.خۆپاراستن لە کاتی بەکارهێنان و کارپێکردنی هەرجۆرە فلاش میمۆریەك( Flash memory ) یان هاردێکی دەرەکی ( External hard ) واتە هاردی گوێزەرەوە کە دەتوانیت وەکو فلاش میمۆری بەکاری بهێنیت, هەروەها هەر جۆرە میمۆریەکی مۆبایل یان کامێرا یان هەر ئامێرێکی تر :

ئەم جۆرە ئامێرانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ گواستنەوەی فایل و زانیاریەکان لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر پێویستە زۆر وریا و بەئاگا بین لە کاتی بەکارهێنانیان چونکە بە دووەهەم رێی گواستنەوە و بڵاو بونەوەی ڤایرۆسەکان دادەنرێت , بۆیە بۆ پاراستنی کۆمپیوتەرەکەمان لە ڤایرۆس پێویستە هەموو کات پاش ئەوەی کە فلاش میمۆریەکە یان هەر جۆرە میمۆریەکی تر مان پەیوەست کرد بە کۆمپیوتەرەکەمانەوە دەست بە جێ نەیکەینەوە واتە بە هیچ شێوەیەك نەچینە ناو فلاشەکەوە!! بەڵکو پێویستە کە پێش هەموو شتێك بچینە ( My Computer ) و کلیکێکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی فلاش میمۆریەکەمان بکەین و پاشان بە پێی ئەو جۆرە ئەنتی ڤایرۆسەی کە لە ناو کۆمپیوتەرەکەمانە بیپشکنین ئەویش بەم شێوەیە :






تێبینی گرنگ: پاش ئەوەی کە فلاش میمۆریەکەت خوێندرایەوە لەلایەن کۆمپیوتەرەکەتەوە ئەگەر ئەم بۆکسەی خوارەوەت هاتە پێش چاو کە ئۆتۆ پلەی پێ دەوترێت ( Auto play ) واتە کرنەوەی ئۆتۆماتیکی , نابێت ڕاستەوخۆ لەم بەشەدا بچینە ناو فلاش میمۆریەکەمان بەڵکو وا باشترە ئەم بۆکسە دا بخەینەوە و پاشان لە ( My





Computer ) دا سکانێکی بکەین بۆ دۆزینەوەی ڤایرۆس ئەگەر تێیدا بوو پاشان لە دواتردا بچینە ناو فلاشەکەمانەوە.

بۆ پشکنینی فلاش میمۆریەکەمان لە ئەگەری بوونی ڤایرۆس تێیدا سەرەتا دەچینە ( My Computer ) پاشان کلیکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی فلاش میمۆریەکەمان دەکەین پاشان سکانی دەکەین , بۆ نمونە ئەگەر ئەنتی ڤایرۆسی کاسپەرسکای( Kasper Sky )ت دابەزاندبێ ئەوا پاش ئەوەی کە کلیکی ڕاستت لەسەر ئایکۆنی فلاش میمۆریەکەت کرد پێویستە بیخەیتە سەر ( Scan for virus ):



پاش ئەوەی کلیکت لەسەر ( Scan for virus ) کرد ئەوا وەکو ئەم شێوەیەی خوارەوە دەست دەکات بە گەڕان و پشکنینی فلاش میمۆریەکەت :



ئەگەر سکان کردنەکە بەم شێوەیە تەواو بوو ئەوا هێمای ئەوەیە کە فلاش میمۆریەکەت پاکەو هیچ جۆرە ڤایرۆسێکی تێدا نیە و دەتوانیت بە دڵنیاییەوە بەکاری بهێنیت:





بەلام ئەگەر لە كاتى سكان كردنەكەدا بەم شێوەیە بوو ئەوا هێماى ئەوەیە كە ئەو فلاشەت یان ئەو میمۆریەت كە سكانى دەكەیت ڤایرۆسى تێدایە و پێویستە لە ناوى بەریت:

بەلام بۆ لەناو بردن و نەهێشتنى ڤایرۆسەكە لەناو فلاشەكەتدا پێویستە كە لەو بەشەى كە لە كاتى دۆزینەوەى ڤایرۆسەكەدا دەركەوتوە كلیك لە ( Apply to all ) بكەین و پاشان ( Delete ) ى بكەین:



پاش ئەوەى كە ڤایرۆسەكەمان لەناو برد و سڕیمانەوە ئەوا وەكو ئەم وێنەى خوارەوەى لێدێت:






## ٣.خۆپاراستن لە کاتی بەکارهێنانی (CD,DVD ) دا:

پێویستە وریاو ئاگادار بین لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە ( CD,DVD ) یەك , چونکە زۆر بەرنامەو سیدی هەن کە ڤایرۆسیان تێدایە چونکە زۆریان کەسێکی ئاسایی یان چەند کەسێك ئەو بەرنامانەیان کۆکردوەتەوەو لەسەر سیدیەك دایان ناوە کە زۆر جار کۆمپیوتەرەکانی خۆشیان ڤایرۆسی تێدایە و هەستی پێ ناکەن . بۆیەشە پێویستە لە کاتی کڕینی هەر بەرنامەو سیدی و دیڤیدیەك ئاگاداری ئەوە بین کە لە سەر سیدیەکە نوسرابێت کە ڤایرۆسی تێدا نیە , یان سیدیەکە هی کۆمپانیایەکی گەورە و ناسراو بێت کە سیدی و دیڤیدی و بەرنامەی زۆریان هەبێت وەکو زۆربەی زۆری ئەم سیدیە ئێرانیانەی کە ئێستا لەبازاڕەکانی ئێمەدا بلاًون کە زۆربەیان هی کۆمپانیای گەورەو ناسراو و بەناوبانگی ئێرانن کە خزمەتی گەورە و زانیاری پێشکەوتوو پێشکەش دەکەن لە زۆربەی بوارەکاندا .
هەروەها سیدیە بیانیەکانی تریش کە جیهانین و متمانەیان پێ دەکرێت لە نەبوونی ڤایرۆس تێیاندا...
بۆ نمونە کۆمپانیای ( EMPEROR ) ی ئێرانی کە یەکێکە لە سەرکەوتوترین کۆمپانیاکانی ڕۆژهەلاًتی ناوەڕاست لەم بوارەدا :





تێبینی :

بۆ پاراستنی کۆمپیوتەرەکەت بە شێوەکی تەواوەتی لە ڤایرۆس پێویستە بێجگە لەو خالاًنەی کە باسمان کرد وریای هەر جۆرە ئامێر و تەکنۆلۆجیایەکی نوێ بیت کە پەویەندی لەگەلْ کۆمپیوتەرەکەت دا بە پادەکات یان پەیوەست دەبێت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە , واتە وریای هەر جۆرە پەیوەندیەك بین لە کۆمپیوتەرەکەمانەوە بۆ دەرەوە و بە پێچەوانەشەوە. بۆ نمونە وەکو ( Network ) واتە پەوەست کردنی دوو کۆمپیوتەر یان زیاتر پێکەوە....



Network Connections

ئەوکتێبەی کەهەمووکۆمپیوتەرێک پێویستییەتی







# چۆنیەتی دابەزاندن و کارپێکردن و نوێکردنەوەی هەردوو ئەنتی ڤایرۆسی (Kaspersky,Nod32) :

سەرەتا پێش ئەوەی کە بچینە سەرباسی دابەزاندنی ئەم دوو دژە ڤایرۆسە , پێویستە بزانین کە بۆچی ئەم دوو دژە ڤایرۆسەمان هەڵبژارد!! ئەگەر بمانەوێت کە بزانین کە باشترین دژە ڤایرۆس( ئەنتی ڤایرۆس ) لە جیهاندا چیە؟ ئەوا لە وەڵامدا بە بێ گومان دەتوانین بڵێین دژە ڤایرۆسی ( Norton ) ە , چەنکە ئەم دژە ڤایرۆسە بە بەهێزترین و باشترین ئەنتی ڤایرۆس دادەنرێت لە جیهاندا هەم بۆ پاراستنی کۆمپیوتەرەکەت بە ئاسایی و هەم لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا, بەلام ئەم دژە ڤایرۆسە کێشەیەکی هەیە لەگەڵ ئێمەدا یان دەتوانین بڵێین لەگەڵ سیستمی کۆمپیوتەرەکانی ئێمە بەگشتی ئەویش ئەوەیە کە سیستمی کۆمپیوتەرەکانی ئێمە بەگشتی کاتێك ئەم دژە ڤایرۆسەی تێدەکەین خاو و سست دەبێتەوە چونکە ئەم دژە ڤایرۆسە زۆر قورسە و دەبێتە هۆی خاو بونەوەی کۆمپیوتەرەکا نمان لە زۆربەی کارەکانی .

بەلام چەندها دژە ڤایرۆسی تر هەن کە جێی ئەم دژە ڤایرۆسە دەگرنەوە چونکە زۆر کارپێکردنیان ئاسانەو کاریگەریشیان نیە لەسەر خاوبونەوەی کۆمپیوتەر و زۆر بەهێزیشن بە مەرجێ کە بەردەوام نوێ( Update ) ی بکەیتەوە, بۆ نمونە ئێمە ئەگەر گرنگترین و باشترین دژە ڤایرۆسی جیهانیشمان هەبێت ئەگەر ئەپ دەیتی نەکەینەوە ئەوا هیچ نیە و پاش ماوەیەك لەگەڵ پەیدا بوونی ڤایرۆسی نوێ ئەم دژە ڤایرۆسەی ئێمە هیچ گرنگیەکی نامێنێت و ناتوانێت ئەو ڤایرۆسە نوێیانە بگرێت کە پەیدا بوون ,چونکە ئەپ دەیت کردنەوە یان نوێکردنەوەی دژە ڤایرۆس واتە پێناساندنی ڤایرۆسە نوێکان بە دژە ڤایرۆسەکەت ,چونکە لەکاتی نوێ بوونەوەی دژە ڤایرۆسەکەتدا لیست و ناو و جۆری ئەو ڤایرۆسە نوێیانەی کە پەیدا بوون پێی دەناسێنێت , بۆیەشە کە ئێمە ئەم دوو ئنتی ڤایرۆسەمان هەڵبژاردوە کە زۆر سووکن و کارپێکردنیان ئاسانە و بۆ ئەوانەشە کە ئینتەرنێت بەکاردەهێنن کە ئەپ دەیتیشمان کردموە ئەوا هیچ ترسێکمان نامێنێت بۆ ئەو ڤایرۆسە نوێیانەی کە پەیدا دەبن.

ئێستا دێینە سەر باسکردنی چۆنیەتی دابەزاندن و کارپێکردن و نوێکردنەوەی دژە ڤایرۆسی( Kaspersky ):

Kaspersky
Anti-Virus

سەرەتا CD دژە ڤایرۆسەکە دەکەینە کۆمپیوتەرەکەمانەوە پاشان دەچینە ( My Computer ) و CD یەکە دەکەینەوە ئەویش بە کلیکی ڕاست کردنە سەری پاشان کلیك کردن لە ( Open ) :





پاش ئەوەی کە CD یەکەمان کردەوە دەبڵ کلیك دەکەین لە فایلی دابەزاندنی ( Kaspersky ) :



دواتر کلیك لە ( Next ) دەکەین :








لەم هەنگاوەدا کە زۆربەی کات لە کاتی دابەزاندنی یاری یان هەر بەرنامەیەك دێتەوە ڕێمان کە پێویستە بۆ ڕازیبوونمان لەسەر دابەزاندنی ئەم بەرنامەیە کلیك لە بازنەی یەکەم بکەین پاشان (Next) :



لەم هەنگاوەشدا کلیك لە چوارگۆشەی یەکەم دەکەین کە (Express installation) ە بۆ ئەوەی کە هەموو



بەشەکان و تایبەتمەندیەکانی بەرنامەکە دابەزێت بە بێ ئەوەی کە خۆمان دیاری بکەین و جیایان بکەینەوە :











لە کۆتا هەنگاوی دابەزاندن دا کلیك لە ( Install ) دەکەین بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە :







کەمێك چاوەڕێ دەبین تاوەکو بەرنامەکە بە تەواوی دا دەبەزێت:

پاش ئەوەی کە بەرنامەکە بە تەواوی و بە سەرکەوتووی دابەزی ئەوا کلیك لە ( Next ) دەکەینەوە:










یك لە ( Next ) یکی تریش دەکەین :




کلیك لە ( Activate later ) دەکەین , بەلاَم ئەگەر کۆدی بەرنامەکەت لابێت کە بەردەوام مانگانە یان چەند کاتێکی دیاری کراو دەگۆڕێت و تۆش پێویستە دووبارە داخلی بکەیتەوە کە تەنها فایلێکە و Activate code مکەی تێدایە ئەوا کلیك لە ( Activate using key file ) دەکەیت ,وە ئەگەر بتەوێت لە ڕێگەی ئینەرنێتەوە بیکرێت ئەوا کلیك لە ( Activate online ) :






# پرۆگرامی ئەنتیڤایرۆسی

# NOD32


نووسینی:

إكرام هادی





# دابەزاندنی

## NOD32



١. لە سیدییەکەدا، لە فۆڵدەری NOD32 دا دەبڵ کلیك لەسەر NOD32 Antivirus بکە.




٢. لە ویندۆ نوێکەدا کلیك لەسەر Next بکە.









٣. کلیك لەسەر Install بکە.




٤. چاوەڕێ بکە تا دیارخەرەکە پڕ دەبێتەوە.





٥. کلیك لەسەر Next بکە.



٦. کلیك لەسەر Next بکە.





٧. کلیك لەسەر I agree بکە.




٨. کلیك لەسەر Next بکە.







٩. کلیك لەسەر Next بکە.




١٠. کلیك لەسەر Next بکە.







١١. كليك لەسەر هەڵبژاردنی یەکەم بکە.



١٢. كليك لەسەر Next بكە.



١٣. کلیك لەسەر Next بکە.




١٤. کلیك لەسەر Next بکە.








ڤایرۆس

١٥. کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Restart later بکە.




١٦. ویندۆیەکی تر دەکرێتەوە، کلیك لەسەر هەڵبژاردنی دووەم بکە.







١٧.كليك لەسەر Finish بكە.




١٨.لە فۆڵدەری NOD32 لە سیدییەکەدا دەبڵ کلیك لەسەر فایلی Patch.exe بکە.



۱۹. لە ویندۆکەدا کە دەکرێتەوە کلیك لەسەر Next بکە.




۲۰. کلیك لەسەر Install بکە.




لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Finish بکە. ئێستا ئەنتیڤایرۆسەکە ئامادەیە بۆ بەکارهێنان. پێش ئەوەی بەکاری بێنیت پێویستە کۆمپیوتەرەکەت ڕیستارت بکەیتەوە (واتە بیکوژێنیتەوە و دایگرسێنیت).









# گەڕانِ بە هەموو ڕام و هەموو هاردەکانی کۆمپیوتەرەکەدا

## ١. بۆ ڤایرۆس

٢. کلیک لەسەر ئایکۆنی NOD32 بکە لە تاسکباردا.





٣. کلیک لەسەر NOD32 بکە.











AntiVir
ڤایرۆس

٤. کلیك لەسەر Local بکە.



٥. ویندۆیەکی نوێ دەکرێتەوە. چونکە ئەمە یەکەم جارتە ئەم پرۆگرامە بەکاردێنیت، پێویستە دیاری بکەیت کە پرۆگرامە چ کردارێك ئەنجام بدات کاتێك کە فایلێك دەدۆزێتەوە کە تووشی ڤایرۆس بووە. بۆیە کلیك لەسەر Stop بکە بۆ ئەوەی کرداری گەڕانەکە بووەستێت و تۆ بتوانیت دیاری بکەیت کە پرۆگرامەکە چ کردارێك ئەنجام بدات.



٦. کلیك لەسەر تابی Actions بکە.





٧. لەم لیست بۆکسەدا Files هەڵبژێرە ئەگەر هەڵنەبژێرراوە.



٨. لێرەدا کلیک لەسەر Clean بکە. واتە هەرکاتێك فایلێك دۆزرایەوە کە تووشی ڤایرۆس بووبوو، یان خۆی ڤایرۆس بوو، ئەوا NOD32 هەوڵدەدات پاکی بکاتەوە لە ڤایرۆس.





٩. بەلاّم ئەگەر فایلەکە نەتوانرا پاك بکرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر فایلەکە خۆی ڤایرۆس بوو، ئەوا لێرەدا بۆ ئەوەی NOD32 فایلەکە بسڕێتەوە (delete بکات)، کلیك لەسەر Delete بکە.




١٠. ئێستا ئیشەکەمان تەواو. کلیك لەسەر Quit بکە بۆ خەزنکردنی ئەم ئیشانەی کە دیاریتی کردووە بۆ NOD32 و دەرچوون لەم ویندۆیە.








١١. لەم دایەلۆگ بۆکسەدا کلیك لەسەر Yes بکە بۆ خەزنکردنی گۆڕانکارییەکانت.




١٢. ئێستا بۆ دووبارە ئەنجامدانەوەی گەڕانەکە، کلیك لەسەر Local بکەرەوە.

١٣.






چاوەڕێ بکە تا پرۆسەی سکانکردنەکە تەواو دەبێت. چونکە لێرەدا NOD32 بە هەموو هاردەکەدا دەگەڕێت، ئەکرێت کاتێکی زۆری پێ بچێت بۆ تەواو بوونی. کاتەکە دەکرێت لە چەند خولەکێکەوە بێت تا زیاتر لە یەك سەعات.



١٤. کاتێك کە پرۆسەکە تەواو دەبێت دوگمەکانی Stop و Pause نامێنن و دەگۆڕێن بە دوگمەکانی Scan & Clean و Scan only. واتە ئەتوانیت ئەم گۆڕانە بەکاربێنیت بۆ ئەوەی بزانیت کە ئایا پرۆسەکە تەواو بووە یان نا. ڕێگەی دیکەش هەیە بەڵام ئێمە تەنها باسی ئەمە دەکەین.




١٥. کلیك لەسەر Quit بکە بۆ داخستنی ویندۆکە.





# گەڕان بۆ ڤایرۆس لە ئەو شوێنانەدا کە خۆت دیاری دەکەیت

لە ویندۆی NOD32 دا کلیك لەسەر NOD32 بکە. (ئەگەر نازانیت چۆن ویندۆی NOD32 بکەیتەوە یان ئێستا نایەتەوە بیرت. تەماشای هەنگاوی (١) ی بەشی پێشوو بکە)




١. کلیك لەسەر Run NOD32 بکە.





۲. لێرەدا ئەتوانیت دەبڵ کلیك لەسەر ئایکۆنی ئەو درایڤە بکەیت کە ئەتەوێت سکان بکرێت، هارد یان سی دی و دیڤیدی یان فلاش. هەر ئایکۆنێك ئیشارەتی سووری لێ درابوو واتە سکان دەکرێت، ئەگەر ویستت سکان نەکرێت دووبارە دەبڵ کلیکی لەسەر بکە بۆ ئەوەی ئیشارەتەکە لابچێت.



۳. بۆ ئەوەی فۆڵدەر و فایل دیاری بکەیت بۆ ئەوەی سکان بکرێن (واتە لە جیاتی ئەوەی هەموو هاردەکە سکان بکرێت، ئەتوانیت تەنها یەك فۆڵدەر یان فایل یان زیاتر دیاری بکەیت بۆ ئەوەی سکان بکرێن)، کلیك لەسەر دوگمەی Add بکە.



٤. لێرەدا بۆ دیاری کردنی فۆڵدەرێك، کلیك لەسەر دوگمەی Folder بکە.




٥. لێرەدا ئەو فۆڵدەرە بدۆزەرەوە کە ئەتەوێت سکانی بکەیت و کلیکی لەسەر بکە.




٦. کلیك لەسەر OK بکە.







٧. كليك لەسەر OK بكە.




٨. ئەگەر ويستت لە جياتى فۆڵدەرێك فايلێك ديارى بكەيت، هەنگاوەكانى (٤) بۆ (٨) دووبارە بكەرەوە بەڵام لە هەنگاوى (٥) دا لەجياتى Folder كليك لەسەر File بكە.




٩. بۆ دياريكردنى فۆڵدەر يان فايلى زياتر، دووبارە كليك لەسەر Add بكە.





١٠. کلیك لەسەر دوگمەی Scan & Clean بکە بۆ دەستپێکردنی پرۆسەی سکانکردن و پاککردنەوەی ئەو ناوچانەی کە دیاریت کردن.




١١. دوای تەواوبوونی پرۆسەکە کلیك لەسەر Quit بکە.




١٢. ئەگەر دایەلۆگ بۆکسەکەی خوارەوە کرایەوە، ئەوا هۆکارەکەی ئەوەیە کە تۆ فۆڵدەر یان فایل یان هاردێکت لەم سکانەی ئەم جارەدا دیاری کردووە کە لە سکانەکەی جاری پێشوودا دیاریت نەکردووە. ئەگەر کلیك لەسەر Yes بکەیت ئەوا NOD32 ئەو فۆڵدەر و فایل و هاردانەی لە بیر دەمێنێت کە ئەم جارە سکانت کردن و جاری داهاتوو کە ویستت سکان بکەیت، NOD32 ئەم فۆڵدەر و فایل و هاردانەت بە ئۆتۆماتیکی بۆ هەڵدەبژێررێت. ئەگەر کلیك لەسەر No بکەیت ئەوا NOD32 ناوچەکانی سکانی ئەم جارەی لەبیر نامێنێت بۆ جاری داهاتوو.





# سکانکردنی فۆڵدەر یان فایل بەشێوەی ڕاستەوخۆ لە ویندۆزەوە

کلیکی ڕاست لەسەر ئەو فۆڵدەر یان فایلە بکە کە ئەتەوێت سکانی بکەیت.

My Pictures

File Edit View Favorites Tools Help

Back Search Folders

Address E:\SYS2\My Pictures Go

Nuclear Paintings People

People's Portrait Photography

Sakina

Refresh the thumbnails for the current selec

Open
Explore
Play in FAN Player
Search by NoClone
Search...
Open New Window
Open as Notebook in OneNote
Upload using CuteFTP Pro
Find Deleted Files with DiskInternals Uneraser...
Refresh Thumbnail
Resco Crypting
Sharing and Security...
Add to archive...
Add to "Sakina.rar"
Compress and email...
Compress to "Sakina.rar" and email
NOD32 antivirus system
Send To
Cut
Copy
Paste
Create Shortcut
Delete
Rename
Properties

1

١. کلیك لەسەر NOD32 antivirus system بکە.

٢. چاوەڕێ بکە تا پرۆسەی سکانکردنەکە تەواو دەبێت.

٣. کاتێك پرۆسەکە تەواو بوو کلیك لەسەر Quit بکە.

# ئەی ڤی جی ئەنتی ڤایرۆسی ٧،٥

# AVG Anti-Virus 7.5

**نووسینی: إکرام هادی**

١. کلیکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی AVG بکە لە سووچی ڕاستی خوارەوەی شاشەکەدا.



٢. کلیك لەسەر Launch AVG Control Center بکە.



## گەڕان بۆ ڤایرۆس

بۆ گەڕان بۆ ڤایرۆس لە فۆڵدەرێکی دیاریکراودا یان لە فلاشێکدا، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە:

١. کلیکی ڕاست لەسەر فۆڵدەرەکە بکە.

٢. کلیك لەسەر Scan with AVG بکە.









٣. AVG دەست دەکات بە گەڕان بەناو فۆڵدەرەکەدا.




٤. دوای تەواوبوونی گەڕانەکە، ئەگەر ڤایرۆس لە فۆڵدەرەکەدا نەدۆزرایەوە، ئەوا ویندۆکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت.



٥. بەڵام ئەگەر ڤایرۆسی تێدا دۆزرایەوە، ئەوا ویندۆکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت.




٦. کلیك لەسەر Display Result بکە.



ویندۆکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت. کلیك لەسەر Virus Results بکە.



لێرەدا ئەو ڤایرۆسانەت پیشان دەدرێت کە دۆزراونەتەوە. کلیك لەسەر یەکێکیان بکە، یاخود هەموویان پێکەوە دیاری بکە بە ڕاکێشانی ماوسەکە بەسەریاندا.









٧. کلیك لەسەر Heal بکە بۆ چارەسەکردنی ڤایرۆسەکە.




٨. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Close بکە.







# گەڕانی گشتی بە کۆمپیوتەرەکەتدا

لێرەدا باسی چۆنێتی ئەنجامدانی گەڕان دەکەین بە هەموو کۆمپیوتەرەکەتدا بۆ ڤایرۆس..

١. دوای کردنەوەی AVG، کلیك لەسەر Test Center بکە.



٢. ویندۆی Test Center دەکرێتەوە. بۆ گەڕان بە هەموو شوێنەکانی کۆمپیوتەرەکەتدا کلیك لەسەر Scan Computer بکە.




٣. ڕاستەوخۆ پرۆسەی گەڕانەکە دەست پێ دەکات.



# نوێكردنەوەی AVG

یەكێك لە گرنگترین بەشەكانی ئەنتی ڤایرۆس بریتییە لە تازەكردنەوەی پرۆگرامەكە لەڕێی ئینتەرنێتەوە. بە بەردەوامی ڤایرۆسی نوێ دروست دەبن. بۆ بەرگری كردن بەرامبەر بەم ڤایرۆسانە كۆمپانیای دروستكەری ئەنتی ڤایرۆسەكە چارەسەر بۆ ڤایرۆسەكە بڵاو دەكاتەوە، تۆش پێویستە ئەم چارەسەرە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە دابەزێنیت بۆ ئەوەی پارێزراو بیت لە ڤایرۆسەكە.

١. دوای كردنەوەی AVG، كلیك لەسەر Check for Updates بكە.





٢. كليك لەسەر Internet بكە.







٣. ويندۆی AVG Update دەكرێتەوە. ئێستا پرۆگرامەكە پەيوەندی دەكات بە ئينتەرنێتەوە.





AVG Update File Download

You are now downloading the latest AVG Update file. When the download i

# ڤایرۆس



٤. باشترین ئەنجامدانی پەیوەندییەکە بە سەرکەوتوویی، ویندۆیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە کە چەند جۆرێکی نوێکردنەوەی تێدایە لە زۆر گرنگەوە بۆ کەم گرنگ. کلیك لەسەر یەکەم بکە کە لە هەموویان گرنگترە.

٥. کلیك لەسەر Update بکە.




٦. پرۆسەی نوێکردنەوەکە دەست پێ دەکات. چاوەڕێ بکە هەتا تەواو دەبێت.






٧. دواى تەواوبوونى دابەزاندنى نوێكردنەوەكە، پرۆگرامەكە هەڵدەستێت بە دانانى فايلە نوێكان لەجێى فايلە كۆنەكان. بەمەش پرۆسەكە كۆتايى دێت.



## ئەم کتێبە بڵاوکراوەی نێوەندی ئارامە مافەکانی چاپدانەوەی پارێزراوە

ARAM

نێوەندی بڵاوکردنەوەی ئارام

ئامادەین بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان بە جوانترین شێوەی هونەری
بەچاپ گەیاندنی رۆمان و چیرۆك و شیعرو بابەتی فەلسەفی و هونەری

ئاسیا: 07701918565
سانا: 07301241518

نرخی (( ٢٠٠٠ )) دینارە

# پرۆژە چاپکراوەکانی نێوەندی ئارام لەبواری تەکنیک

## بۆ دەست کەوتنی ئەم کتێبانە پەیوەندی بکەن بەنێوەندی ئارامەوە

سانا: 07301241518

ئاسیا: 07701918565

نوێترین سستەمی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر ویندۆز ڤیستا

Windows Vista

Aram

کۆمپیوتەر سۆفت وەیر

فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر
مایکرۆسۆفت وێرد
مایکرۆسۆفت ئێکسڵ
مایکرۆسۆفت ئێکسس
ئەدۆب فۆتۆ شۆپ
بەرنامە گرنگەکانی ویندۆز xp
3ds max
بەرنامەی فلاش
Movie Maker
میدیا ستۆدیۆی 8
میدیا پلەیەر
کێشەکانی کۆمپیوتەر و چارەسەرکردنیان

Aram

ئامادەکردنی: محمد مهدی

ماکرۆمیدیا فلاش 8

Kurdfox
Technology news

فۆتۆشۆپ

PHOTO SHOP

Aram

پرۆگرامی ئۆتۆکادی 2007

Aram

Autodesk
AutoCad 2007

بەکارهێنانی کۆمپیوتەر

Aram

گرنگەکانی کۆمپیوتەر

Aram

EXCEL XP

ئێکسڵ ئێکس پی

Aram

هەموو پەشەکانی فۆرمات لە هەنگاوی ئاسان و سادەدا

XP
VESTA

Aram

نوێترین سستەمی بەکارهێنانی ئینتەرنێت

Aram

میدیا ستۆدیۆی 8 هەنگاو بەهەنگاو

Aram

MediaStudio Pro 8

ئامادەکار
نیگرام هادی

